ناوی کتێب : چەمکی ژینگەپارێزیی لە ئیسلامدا
ئامادەکاری: سەردار عەبدولڕەحمان
نەخشەسازیی : هونەر عوسمان
نۆبە و ساڵی چاپ : چاپی یەکەم / ٢٠١٨
تیراژ : ٥٠٠ دانە
نرخ : ١٠٠٠

## پێش دەستپێك:-

ئیسلام وەك ئاییینێكی درێژەپێدەری پەیامەكانی ئاسمان بە زەوی و تەواوكەری ئاییینەكانی پێشتر، هەروا وەك مەنهەج و دەستوور و شەریعەتێكی تێرو تەواو و گونجاو بۆ هەموو سەردەم و شوێنێك، شتێكی وەهای نەهێشتۆتەوە و قسەی لەسەر نەكردبێت و چوارچێوەی بۆ دانەنابێت.

ئەگەر هەریەك لەئێمە سەرنجبدات لە زۆرێك لەئایەتەكانی قورئانی پیرۆزو فەرموودەكانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بێت. دەبینین كە خوای گەورە ئەو سروشتە جوانەی بۆ ئادەمیزاد خولقاندووە، زۆربەی شتەكانیشی دەستەبەری دەستی مرۆڤ كردووە. هەروەك خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ﴾ الجاثية: ١٣

واتا: هەرچی لەئاسمان و زەویدا هەیە خوای گەورە بۆ ئێوەی ڕامهێناوە. بۆخزمەتكوزاری فەراهامی هێناوە هەمووشی تێكڕا بەخششن لەلایەن ئەو زاتەوە).

## بنەماكانی ئامانجی ئایینی پیرۆزی ئیسلام :-

ئاشكرایە ئامانجی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بۆ مرۆڤایەتی دوو بنـــەمای گـــرنگ لـــەخۆ دەگرێـــت كەئـــەویش خـــۆی دەبینێتەوە لەفەرمانكردن بەچاكە و بەشێوەیەك هەرچییەك لەبەرژەوەندی مرۆڤ و ژیانی بێت پێی باشە.داواش ئەكات مرۆڤەكان هەمیشە خەمخۆری هەنگاوی چاكەو چاكەكاری بن. دیارە (ژینگە پارێزیش) لەچوارچێوەی ئەو ئامانجەش یەكێكە لەكارە باشەكانی مرۆڤایـەتی لەپێناو بەدیهێنانی ژیـانیكی چاك بۆخـۆی و نـەوەكانی. هـەروەها ئامـانجێكی تـری ئـایینی ئیسـلام خـۆی دەبینێتـەوە لـە قەدەغـەكردنی هـەموو شـتێكی خـراپ و نابـەجێ. بـۆ ئـەوەی مـرۆڤ لـەم نێوەنـدەدا نەبێتـە ئـامرازی شـەڕو تێكـدان و نانـەوەی ئاشووب و تێكدانی شروشتی جوانی ژینگە.چونكە خوای گەورە هەمیشە داوای ئەوەمان لیدەكات كە زەوی ئاوەدان بكەینەوە و سوپاسی بەخششەكانی بكەین . خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموویت﴿ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ

فِيهَا ﴾ هود: ٦١ واتا : (ئەو خوایە بەرپای کردوون لەزەویدا داوای لێکردوون ئاوەدانی بکەنەوە)..

ئاشکرایە چەمکی(ژینگەپارێزی) لەئاییني پیرۆزی ئیسلامدا.کەخۆی دەبینێتەوە لەپاراستنی کۆی بوونەوەرەکان و پێکهاتەیان بەهەموو جۆرێکیانەوە کە لەلایەن خوای گەورەوە بۆ ئادەمیزاد فەراهەمکراون.پاراستن و گرنگی پێدانیان ئەرکێکی ئاییني و نیشتیمانی و کۆمەلأیەتیە، وەمرۆڤەکانیش لەسەر ئەم زەمینە بەرپرسیارن لەدەستەبەرکردن و گرنگی دان بەئاسایشی ژینگەیی. خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا سەرەبات بە بەخششەکانی خۆی بۆ مرۆڤ دەفەرموویێت ﴿ وَٱلْأَرْضَ مَدَدْنَٰهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَٰسِيَ وَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ شَيْءٍ مَّوْزُونٍ ﴿١٩﴾ ﴾ الحجر:١٩

واتا: ( زەویمان راخستووە چیاو کێوەکانمان لەسەرداناوە.لەهەموو جۆرە ڕووەك و بەربوومێکمان تێدا ڕواندووە. بەشێوەیەکی رێکوپێك و بەئەندازەی پێویست دیاریکراوە).

**کۆڵەکەکانی ژینگەی مرۆیی لەئاییني پیرۆزی ئیسلامدا :-**

دروستکردنی ئەوەی لەنێوان زەوی و ئاسماندایە بۆ خزمەتی مرۆڤ و خواردنی بەرهەمەکانی زەوی و، بەکارهێنانی کەرەستە و هۆیەکانی گواستنەوەی ئاسمانی و دەریایی و زەمینین کەئادەمیزاد پەی پێ بردووە و پەی پێدەبات، بەشێکی گرنگی کۆڵەگەکانی ژینگەیی مرۆین.چونکە ئادەمیزاد خۆی و زانیاری و زانستەکەی کەرەستە خاوەکان. هەرهەمووی بەخششی خوای بەدیهێنەری و تواناو زانیارییە. لەسەر هەر یەك لەگرۆی ئادەمیزاد پێویستە سوپاسگوزار و ستایشکاری خوای گەورەبیت لەبەخشینی نیعمەتەکانی بەمرۆڤ وە پێویستیشە مرۆڤ لەماوەی ژیانیدا پاریزگاری لەنیعمەتەکانی خوای گەورە بکات و زیادەڕەوییان تێدا نەکات. خوای گەورە لەزۆر شوێنی قورئانی پیرۆزدا جەخت لەبەخشراوەکانی خۆی دەکات لەسەر ڕووی زەوی بۆ مرۆڤایەتی. هەروەك خوای گەورە لەم چەند ئایەتانەی خوارەوەدا باسی بەخششەکانی ئەکات بۆ گرۆی ئادەمیزاد کە زەوی پێ ئاوەدان بکەنەوەو تێدا کاروباری خۆیان تێدا راپەرێنن و پارێزگاری لێ بکەن.

خـوای گـەورە دەفـەرمووێت﴿ وَٱلۡأَنۡعَٰمَ خَلَقَهَاۗ لَكُمۡ فِيهَا دِفۡءٞ وَمَنَٰفِعُ وَمِنۡهَا تَأۡكُلُونَ ﴿٥﴾ ﴾النحل ٥.

واتا: (ماڵاتی دروستکردووە بۆ خزمەتی ئێوە (لەخووری و موو و پێستیان جۆرەها پۆشاك و ڕایەڵ دروستئەکەن) کەگەرمیتان پێ دەبەخشن و ( لەسەرماو سۆڵە) هەروەها جۆرەها سوودی تری لێوەردەگرن.لەشیرو گۆشتەکەشی دەخۆن).

خوای گەورە لەئایەتێکی تردا دەفەرمووێت﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي سَخَّرَ ٱلۡبَحۡرَ لِتَأۡكُلُواْ مِنۡهُ لَحۡمٗا طَرِيّٗا وَتَسۡتَخۡرِجُواْ مِنۡهُ حِلۡيَةٗ تَلۡبَسُونَهَا وَتَرَى ٱلۡفُلۡكَ مَوَاخِرَ فِيهِ وَلِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿١٤﴾ ﴾ النحل ١٤.

واتـا: (هـەر ئـەو زاتەیـە کـە دەریـای بـۆ بارهێنـاون و تـا گۆشتی تەڕ و تازەی لێبخۆن، تا لەناویدا جۆرەها گەوهەر و مرواری دەربهێنن و لەدەست و ملی بکەن، هەروەها کەشتیەکان دەبینن دەریا لەت ئەکەن و تافەزڵ و بەخششی تری پەروەردگار بەدەست بهێنن. بۆ ئەوەی سوپاس گوزاریشی بکەن).

خوای گەورە لەئایەتێکی تردا سەبارەت بەگرنگی و بایەخی ئاژەڵ بۆ مرۆڤایەتی دەفەرمووێت﴿ وَٱلْخَيْلَ وَٱلْبِغَالَ وَٱلْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨﴾ ﴾ النحل ٨ .

واتا : (هەروەها جۆرەها ئەسپ و ماین و ئێستر و گوێ درێژی بۆ بەدیهێناون تابۆ سواری و گواستنەوە بەکاری بهێنن سەرەڕای دیمەنی قەشەنگیان شتی تریش دروست دەکات کە ئێستا ئێوە نایزانن).

*******

## بەڵگە ئایەتییەکان لەسەر زیادەڕەوییەکانی مرۆڤ و تێکدانی ژینگە لە سەر ڕووی زەویدا :-

بەپێی زۆرێك لەدەقەکان دەگەینە ئەو ڕاستییە، کە وەك چۆن مرۆڤ پێویستی بە پاکوخاوێنی خۆی هەیە، تا تەندروستی نەکەوێتە مەترسی و تووشی نەخۆشی و شێواوی نەبێت، بەهەمانشێوە داخوازیشی لەمرۆڤ ئەوەیە کەژینگەی خۆی پاك و ڕێك و خاوێن ڕابگرێت و پارێزگاری لێ بکات، بۆئەوەی لە کەشێکی ئاسایی و تەندروستیەوە ژیان بگوزەرێنن و، لە ناهەمواری و کاری تێکدەری و نائارامیی و زیادەڕەوی و پەشێوییەوە دووربن.

بۆیە خوای گەورە لەچەندین ئایەتدا هەڕەشەی ئەوەمان لێدەکات کەمرۆڤ زیادەڕەوی بکات لە نیعمەتەکانی و بەخششەکانی، چونکە ئەوەی ڕەچاوی بنەما سەرەکییەکانی پارێزگاری ژینگە نەکات، ئەوەی بەهەر هۆبێت ببێتە هۆکاری دروستبوونی مەترسی ژینگەیی.

ئەوەی پاکوخاوێنی و سروشتی جوانی ئاو و پاکی هەواو سیمای دارستان و گژوگیا نەپارێزێت، ئەوە نەك خۆشەویستی خوای گەورە نیە بەڵکو خوای پەروەردگار

لێشی ڕازی نابێت و سەرەنجام تووشی لێپێچینەوەش دەبێت. لێرەدا گرنگترین ئەو بەڵگە ئایەتیانە دەخەینەڕوو کە خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا ئامارژەی پێکردوون سەبارەت بە زیادەڕەوییەکانی مرۆڤ لەبەخششەکان و نیعمەتەکانی لەسەر ڕووی زەوی کەبێگومان ئەمەش ئامارژە و مەترسییەکی گرنگە بۆ سنووردانەنانی مرۆڤ لەچۆنیەتی سوود وەرگرتن لە دەرامەتەکانی زەوی.

١- قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾ ﴾ الروم ٤١

واتا : ( تاوان و خراپە دەرکەوتووە، هەموو سەر زەوی و دەریاکانیشی گرتۆتەوە، بەهۆی ئەو تاوان و گوناهانەوە. کەخەڵکەکەی دەستیان داوەتێ. سەرەنجام تاڵاوی هەندێك لەکردەوەکانیان بچێژن( بەرپابوونی کارەساتە سروشتیەکان ) بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ ڕێبازی پاکی خواناسی)

٢- قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ وَلَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَٰحِهَا ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾ الأعراف: ٨٥

واتـــا : ( تـــۆوی فەســـادو تاوانبـــاری و گونـــاه لەزەویـــدا مەچێنن و دوای چاکسازی بوونی، ئەوانە چاکترە بۆتـان ئەگەر ئێوە باوەڕداران).

٣- قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ وَأَنَّ ٱلْمُسْرِفِينَ هُمْ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ﴾ غافر ٤٣.

واتا : ( بێگومان زیادەڕەوانن هاوەڵانی ئاگری دۆزەخن).

٤-قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ وَلَا تُسْرِفُوٓا۟ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴾ الاعراف: ٣١

واتا : ( بخۆن و بخۆنەوە (بە ناز و نیعمەتەکان) زیادەڕەوی مەکـەن. چـونکە خـوا بەڕاسـتی لەسـنوور دەرچـووان و زیادەڕەوانی خۆش ناوێت).

٥- قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ وَمَن يُبَدِّلْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴾ البقرە ٢١١.

واتا : ( جا ئەوەی نیعمەتی خوا بگۆڕێت دوای ئەوەی بۆی هاتووە، ئەوا بەڕاستی خوا تۆڵەی زۆر سەخت و بەئازارە).

٦-قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ إِنَّ ٱلْمُبَذِّرِينَ كَانُوٓا۟ إِخْوَٰنَ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴾ الاسراء ٢٧.

واتا: ( بەڕاستی زیادەڕەوان دۆست و برای شەیتانەکانن ).

٧- قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْفَسَادَ ﴿٢٠٥﴾ ﴾ البقرە ٢٠٥.

واتا: ( خوا خراپەکارانی خۆشناوێت).

٨- قَالَ تَعَالَى: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴾ البقره٢٢٢.

**واتا : ( بەڕاستی خوای گەورە تۆبەکارانی خۆشدەوێت و پاکەکانی خۆشدەوێت).**

٩- قَالَ تَعَالَى: ﴿ كُلُواْ وَٱشْرَبُواْ مِن رِّزْقِ ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْاْ فِي ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴾ البقره٦٠.

**واتا: ( بخۆن و بخۆنەوە لەرزق و رۆزی و بەخششی خوا. تاوان و خراپە مەکەن لەسەر زەویدا، کەبەچاندنی تۆی خراپەوە خەریکن).**

١٠-قَالَ تَعَالَى: ﴿ وَلَا تَبْغِ ٱلْفَسَادَ فِي ٱلْأَرْضِ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴾
القصص ٧٧.

**واتا: ( نەکەیت هەوڵی فەساد و گوناه و تاوان بدەی لەزەویدا، چونکە بەڕاستی خوا ئەو کەسانەی خۆش ناوێت تۆووی خراپە دەچێنن).**

## چـــەمکی ژینگـــە پـــارێزی لـــە ژێـــر ســـایەی فـــەرموودەکانی پێغەمبەر( صلی الله علیه وسلم ):-

ئاشکرایە بەشێوەیەکی گشتی ئیسلام بایەخی تەواوی داوە بـــە بابەتـــە ژینگەییـــەکان، ئەمـــەش لـــە قورئـــان و فـەرموودەکانی پێغەمبـەر (صـلی اللـه علیـه وسـلم) ڕەنگـی داوەتـەوە، وە هـەروەها ڕێنمـایی زۆر و چڕوپڕیشـی بـەیان کـــردووە بـــۆ مرۆڤـــەکان، وەهـــانی مـــرۆڤیش دەدات کـەپارێزگاری لـە ژینگـە بکـات و هەمیشـە لاگـیری خێـر و ئاوەدانی زەوی بێت، نەك خوانەخواستە سەرقاڵی تێکدان و پشێوی نانـەوە و کـاری خـراپ و شێواندنی ژینگـە، بۆ ئـەو مەبەستەش ئیسـلام چـەندین ڕێسـاو ڕێنمـایی دانـاوە، کـە جێبەجێکردنیان ئەگەری ژینگەیەکی تەندروست بۆ گرۆی ئـادەمیزاد دێنێتـە کایـەوە، بۆیـە ئەرکـە لـەبارەی ژینگـەوە هـــەمووومان لـــەوە هۆشـــیار بـــین و وەك هەســـتکردن بـــە بەرپرسـیارێتی ئـایینی و مرۆیـی و نیشـتیمانی، بەئـەرکی پارێزگاری ژینگە هەڵبستین،

بۆیـە لـەم ڕێگـەیـەوە پێغەمبـەری خـوا ((صـلی اللـه علیـه وسلم)) چـەندین فـەرموودە و ڕێنمـایی هەیـە بـۆ پاراسـتنی

ژینگــه کــەخۆی دەبینێتــەوە لــەبوارەکانی (دارســتان و سەرچـاوەکانی ئـاو سـامانی ئـاژەڵ و پاکوخـاوێنی مـرۆڤ خــۆی) هــەروەك چــۆن پێغەمبــەری خــوا (د.خ) بێــت دەفەرمووێت (لاضر ولاضرار). بەپێی ئەم فەرموودەیە و یاسا شــەرعی و فیقهیــە. هــەموو شــێوەکانی زیانگەیانــدن قەدەغـەکراو و حـەرامـە.واتا نەدروسـتە زیـان لـەخۆت بـدەی نەدروستیشە زیان بە دەوروبـەری غـەیری خۆت بگەیـەنیت. جـا لێـرەوە چـەند لایـەنێك دەخـەینـەڕوو کـە ئیسـلام بـەو هۆیەوە هانمان دەدات و هۆشیارمان دەکاتـەوە بۆ پاراستن و پارێزگاریکردنی ژینگە.لەوانە :-

**هاندان بۆ نەمام چاندن و سەوزایی لەفەرموودەکانی پێغەمبـەری نازدارمان محمد( صلی الله علیەوسلم ) :-**

١- عن أنس - رضي الله عنه - قال : قال النبي - صلى الله عليه وسلم - : ( ما من مسلم يغرس غرسا، أو يزرع زرعا، فيأكل منه طير أو إنسان أو بهيمة إلا كان له به صدقة )(البخاري) .

واتـا: (هـیچ موسـڵمانێك نییـە کـە درەختێـك بنێـژێ لـە هەرزەوییەکـدا، یـان تۆوێـك بکاتـە بـن زەوی و پاشـان

پەلـەوەر، یـان ئـاژەڵ، یـان مـرۆڤ، سـوود مەنـد بـبن لـەو بەرووبوومانە، بۆ ئەو دەبێتە خێر و بۆی دەنووسرێت ).

٢- قال النبي ـ صلى الله عليـه وسلم ـ : (ما من مسلم يغـرس غرسا، إلا كان ما أكل منه له صدقة، ومـا سـرق منـه لـه صـدقة، ومـا أكـل السبع منـه فهـو لـه صـدقة، ومـا أكلـت الطـير فهـو لـه صـدقة، ولا يـرزأه أحـد (أي لا ينقصـه ويأخـذ منـه) إلا كـان لـه صدقة)وفي رواية له: إلى يوم القيامة).

واتا: (هـەر موسڵمانێك شینایەتییەك لـە زەویـدا بـچێنێت، هێندەی لێی بخورێت، بۆ ئـەوخێرە، ئیتر سوودلێكردنەكە، لە لای هەركەسێكەوە بێـت، چەندیشـی لـیّ بـدزێت، بۆئـەو هـەرخێرە، هەركەسـێكیش بەمـەرامی خراپـە و بۆكەمكردنەوەی لێی نزیـك ببێتـەوە، هـەر بۆ ئـەو خـاوەنـەی بەخێردەنووسرێت).

٣- وعن رجل من أصحاب النبي(ص)قال: سمعت رسول الله (صلى اللة علية وسلم)بأذني هاتين يقول: (من نصب شجرة، فصبر على حفظها، والقيام عليها حتى تثمر، فإن له في كل شئ يصاب من ثمرها صدقة عند الله عز وجل).

واتا: (یەکێك لە یار وسەحابەکانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: گوێم لە پێغەمبەر بوو(د.خ)کە فەرمووی: هەرکەس درەختێ بنێژێ و دانی ئارام بەخۆیدا بگرێت لەسەرپاراستنی تا دێتە بەرهەم، هەرکەس سوودمەند ببێت لە بەربوومەکەی لای خوا بۆ ئەم بەخێر بۆی دەنوسرێت).

٤ - وعن انس - رضي الله عنه - قال : قال رسول الله - صلى الله عليه وسلم - : ( إن قامت الساعة وبيد أحدكم فسيلة(نخلة صغيرة) فإن استطاع أن لا يقوم حتى يغرسها فليفعل )( أحمد).

واتا: (گەرهات و یەکێك لەئێوە نەمامێکی بەدەستەوەبوو دەیویست بینێژێ و لەوکاتەدا دنیا کۆتایی هات، ئەگەردەرفەتی هەبوو با کۆڵ نەدا و درەختەکە بنێژێت).

٥- وعن جابر - رضي الله عنه - أن رسول الله - صلى الله عليه وسلم - قال : ( من أحيا أرضا ميتة فله فيها أجر)( أحمد ) .

واتا: (هەر کەسێك زەویەکی ووشك بوو بکاتە کشتوکاڵ (زیندووی بکاتەوە) ئەوا پاداشت وەرئەگرێت.

٦- والرسول صلى الله عليه وسلم حث على حماية البيئة ومكوناتها، وليس أدل على ذلك من وصاياه التي أوصى بها جيشه

في غزوة مؤتة وهو يتأهب للرحيل: ("لا تقتلوا امرأة، ولا صغيرا رضيعا، ولا كبيرا فانيا، ولا تحرقوا نخلا، ولا تقلعن شجرا، لا تهدموا بيوتا).

واتا: ( پێغەمبەری خوا ((صلى الله عليه وسلم)) لەجەنگی (مؤتة) وەسیەتی کردووە بە سوپاکەی کە ئافرەت نەکوژن، منداڵی شیرەخۆرە نەکوژن، پیر و پەککەوتە نەکوژن، ئاگر لەدارخورما بەرنەدەن، دار مەبڕن، و خانووەکانیش تێك مەدەن).

٧- حديث النبي –صلى الله عليه وسلم- الذي رواه أبو داود وصححه الألباني عن عبد الله بن حبشي –رضي الله عنه- عن النبي –صلى الله عليه وسلم- قال: (من قطع سدرة صوب الله رأسه في النار)

واتا : (هەرکەسێك داری (سوب) ببڕێت خوای گەورە سەری دەخاتە ناو ئاگر).

٨-قال رسول الله - صلى الله عليه وآله وسلم (لا تقوم الساعة حتى تعود أرض العرب مروجا وأنهارا ).

واتا : (ڕۆژی دوایی نایەت هەتا زەوی عەرەب نەبێتەوە بە باخچە و ڕووبار) امام مسلم..

زانایانی ئەمڕۆ ئەوە دووپات دەکەنەوە کەدوورگەی عەرەب لەڕابردوودا باخچە و ڕووبارببووە. لەچەند وێنەیەکی دوورگەی عەرەبدا کە ئاژانسی ئاسمانی ئەمەریکی (ناسا) گرتوویەتی شوێنەواری دەریا و ڕووباری شاردراوە داپۆشراوە لەهەزاران ساڵەوە لەژێر خاکەوە دەردەکەوێت. ئەم ناوچەیە بەهۆی دەورانی کەش و هەواوە جارێکی تر دەگەڕێتەوە بۆ باری پێشووی خۆی .هەروەك لەفەرموودەکەی پێغەمبەر ((صلى الله عليه وسلم)) ئاماژەی بۆکراوە.

ئەمەی خوارەوەش چەند هەڵوێستێکی ناوازەی هاوەڵانی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)لەسەر گرنگی و بایەخی نەماو چاندن و سەوزایی :-

ا- (روي أن رجلا مر بأبي الدرداء (ر )، وهو يغرس جوزة). شجرة جوز) فقال: أتغرس هذه وأنت شيخ كبير، وهي لا تثمر إلا في كذا وكذا عاما؟ فقال: أبو الدرداء: ما عليّ أن يكون لي أجرها، ويأكل منها غيري؟!).

واتا: ( دەگێڕنەوەکابرایەك بەلای ئەبودەردائدا تێپەڕی کە چوو بووە ساڵەوە و لەوکاتەدا خەریکی ناشتنی درەختێکی

گوێز بوو، کابرایش پێی دەڵێ: تۆ بەم تەمەنەوە خەریکی ناشتنی ئەو درەختە گوێزەیت کە دەزانی زۆردرەنگ دێتە بەرهەم؟ ئەویش دەڵێ: جا چی تێدایە بەڵکوکەسانی دی لە بەرهەمەکەی بخۆن).

ب- قال ابوبكرالصديق (رضى اللة عنة) (أغزوا باسم اللهن لاتقتلوا وليدا، ولاامراة، ولا شيخا مسنا، ولا تهدموابيتا ،ولا تقطعوا شجرة).

واتا : ( ئەبوبەکری صدیق خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت بەناوی خوا دەستبکەن بەجەنگ منداڵ و ژن و پیاوی بەساڵاچوو مەکوژن و خانووەکان وێران مەکەن و دارەکانیش مەبڕن).

ج- (روى ابن جرير عن عمارة بن خزيمة بن ثابت قال: سمعت عمر بن الخطاب يقول لأبي: ما يمنعك أن تغرس أرضك؟ فقال له أبي: أنا شيخ كبير أموت غدا! فقال عمر: أعزم عليك لتغرسنها! فقد رأيت عمر بن الخطاب يغرسها بيده مع أبي)

واتا: (عومەری کوڕی خەتاب(ر.ض) بەکابرایەکی پیر و بەتەمەنی گوت: ئەوە ڕێگر چییە لەبەردەمتدا کە تۆ نایەیت زەوییەکەت بێنیتە بەرهەم و جوتیاریی تێدابکەیت و

خزمەتی بکەی؟ ئەویش گوتی: من پیاوێکی بەساڵا چووم و سبەینێ دەمرم!، عومەریش فەرمووی: داوات لێدەکەم زۆر بە مکوورپیەوە کە دەبێ بینێژی و ئیتر عومەر بۆخۆی دەستی کرد بە نەمام ناشتن لەگەڵیدا) .

## هاندان بۆ پاراستنی ڕێگەوبان لەفەرموودەکانی پێغەمبەری نازدارمان محمد (صلی الله علیه وسلم):-

سەبارەت بە پاکوخاوێنی ڕێگا وبان گەلێ فەرموودەی پێغەمبەرمان بەدەستەوەیە(صلی اللە علیە وسلم)، کە بە زۆری هانی بڕواداران دەدەن بۆپاراستنی دەورو بەر و ڕێگا و بان، وەك ئەوفەرموودەیەی کە کە بەیەکێك لە جۆرەکانی ئیمان ئەوە دادەنێت کە خەوشوخاڵاك و ناڕەحەتی و ئەزییەتی ڕێگاوبان لابردن بەشێکە لەبەشەکانی ئیمان .

١- قال رسول (ص) : ( إماطة الأذى عن الطريق صدقة ).

واتا : (هەرکەسێك شتێك لابدات لەسەر ڕێگا کە ئازاری خەڵك بدات ئەوە بە خێر بۆی ئەژمار دەکرێت).

٢- عن ابى هريرة(ر.ض) .ان رسول الله (ص) (: الذي يتخلى في طريق الناس، وفي ظلهم : الذي يتخلى في طريق الناس، وفي ظلهم) .قال: (اتقوا اللاعنين:قالو: وما اللعان يارسول الله؟ قال : الذي يتخلى في طريق الناس، وفي ظلهم).

واتا: (خۆتان بپارێزن لەوشتانەی کە دەبنە هۆکاری نەفرین کردن لێتان، ئەوکەسەی لە سەرڕێگا و بانی خەڵکی، یان لە سێبەردا پیسی دەکا و تارەت دەگرێت).

٣- عن معاذ بن جبل (رض). ان رسول الله (صلى الله عليه وسلم) .قال : (اتقوا الملاعن الثلاث: البراز في الموارد، وقارعة الطريق، والظل).

واتا: (خۆتان لەوسێ شتەبپارێزن، کە دەبنەهۆکاری نەفرین کردن لێتان، تارەتگرتن لە سەرچاوەی ئاو و شوێنی ئاو هەڵگۆستن و لەسەرەڕێگا و بن سێبەر).

٤- روي الإمام مسلم في صحيحه عن أبي سعيد الخدري-رضي الله عنه- عن الرسول صلي الله عليه وسلم قال:" إياكم والجلوس في الطرقات قالوا: يا رسول الله ما لنا بد من مجالسنا نتحدث فيها .قال.صلي الله عليه وسلم :إذا أبيتم إلا المجلس فأعطوا الطريق

حقه . قالوا: وما حقه . قال: " غض البصر وكف الأذى ورد السلام والأمر بالمعروف والنهي عن المنكر".

واتا : (پێغەمبە ر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (لەسەر رێگا دامەنیشن) ئەوانیش وتیان ناتوانین لەسەر رێگا دانەنیشین و قسەی تێدا نەکەین، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی ئەگەر هەر وازناهێنن لەسەر رێگا دەبێت مافی رێگا بدەن. وتیان مافی رێگەوبان چییە؟ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: پاراستنی چاو لەحەرام و نەبوونی ئازار و زیان بۆ هیچ کەسێك، وەلامدانەوەی سەلام. رێنماییکردنی سەرلێشواو رێپیشاندەر فەرمانکردن بە چاکە و قەدەغەکردن لەخراپە.

٥- قال رسول (ص) ( بينما رجل و يمشى بطريق وجد غضن شوك على الطريق فاجرة فشكر الله فغفر لة).

واتا : ( جارێك پیاوێك بەرێگایەك داڕۆیشت چاوی بەلقەدارێکی دڕکاوی کەوت ئەویش فرێیدا و لەسەر رێگای خەڵك دووری خستەوە، خوداش لە پاداشتی ئەو کارەی لێی خۆش بوو سوپاسیشی کرد.

٦- روي الإمام البخاري في صحيحه عن ابي هريرة- رضي الله عنه- قال : قال رسول الله صلي الله عليه وسلم : ( الايمان بضع وستون شعبة أعلاها لا إله إلا الله وادناها إماطة الأذى عن الطريق) .

واتا : ( ئيمان حەفتاو ئەوەندە بەشەیە هەرەبەرزەکەی ووشەی (لا إله إلا الله ) یه . هەره خوارەوەشی ئیمان لادانی شتێکه لەسەر رێگا کەئازاری هەیه بۆ مسوڵمانان).

## هاندان بۆ پاراستنی سەرچاوەکانی ناو لەفەرموودەکانی پێغەمبەری نازدارمان محمد (صلی الله علیه وسلم ):-

١- روى عن عبدالله بن عمر (ر.ض) قال .إن النبى صلى الله عليه وآله وسلم مَرّ بسَعْد وَهُوَ يَتوضَّأ فقَال: (مَا هَذَا السَّرَفُ؟. فقال: أفِى الوُضُوء إسْرافٌ؟ قال: «نعَمْ، وَإنْ كُنت علَى نَهَرٍ جارٍ. رواه أحمد وابن ماجة).

واتا : پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بەلای (سەعد)دا تێپەڕی کەسەرقاڵی دەستنوێژ هەڵگرتن بوو پێی فەرموو (ئەوە چیه ئەو زیادە ڕەوییه؟ سەعدیش (ر.ض) دەڵێ بۆ لە دەستنوێژیش زیادەڕەویکردن هەیه؟ پێغەمبەر (د.خ)

لەوەلامدا ئەلێت: بەلی لەدەست نوێژیش ئاو زیاد بەفیرۆ بدەیت زیادە ڕەویی کردنە.با لەسەر ڕووبارێکی ڕۆیشتووش بیت.

٢- عنْ أبي هُرَيْرَة ، قالَ: قالَ رَسُولُ الله صلى اللهُ عليه وسلم :
(لا يبُولنَّ أحدُكُمْ فِي الماءِ الدَّائِمِ ، ثمَّ يغتسِلُ مِنهُ)
واتا : (میز مەکەنە ناو ئاوێکی وەستاو و پاشان خۆشتانی تێدا بشۆن).

٣- عن أبي الزبير عن جابر عن رسول الله صلى الله عليه وسلم أنه (النهى عن البول في الماء الراكد).
واتا : ( پێغەمبەر (د.خ) ڕێگری کردووە لەوەی میز بکرێتە ناو ئاوێکی وەستاو (مەنگ).

٤- ژیاننامەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پڕیەتی لە هاندان و بایەخدان بە پاراستنی خواردن و خواردنەوە و پارێزگاری کردن، لە پاکوخاوێنییەکەیان، تا ئەوەی کە بە پێویستی بگێڕێت لەسەرمان کە شەوانە، لەکاتی خەودا سەری قاپ و بەقرەج و سەتڵ و ئەوئامێرانەی کە بەکاریان دێنین، خواردن و خواردنیان تێدابێت، سەریان بنێینەوە و ئاگر بەهەلگیرساوی بەجێ نەهێلین و دەفەرمووێت: (إذا

نمتم فأطفئوا المصباح، وأغلقوا الأبـواب، وأوكـوا الأسـقية -اربطوا قرب الماء- وخمروا الشـراب).

لەفەرموودەیەکی دیکەدا دەفـەرموێت:(أغلقوا أبواكم وخمـروا أنيتكم- غطوها- وأطفئـوا سرجكم.وأوكئـــوم أسقيتكم).

**هاندان بۆ پاراسـتنی گیانـداران لەفـەرموودەکانی پێغەمبـەری نازدارمان محمد (صلى الله عليه وسلم):**

١- عَنْ عَمْرِو بْنِ الشَّرِيدِ ، قَالَ : سَمِعْتُ الشَّرِيدَ ، يَقُولُ : سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، يَقُولُ (مَنْ قَتَلَ عُصْفُورًا عَبَثًا عَجَّ إِلَى اللَّهِ تَعَالَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ ، قَالَ : يَا رَبِّ إِنَّ فُلانًا قَتَلَنِي عَبَثًا وَلَمْ يَقْتُلْنِي لِمَنْفَعَةٍ).

واتا : ( چۆلەکەیەکی کوژراو کە بـەبێ هـۆ بەگاڵتـە کـوژراوە سکاڵای خۆی کـرد لـەڕۆژی دواییـدا لای خـوا گـەورە.دەڵێت ئـەی پـەروەردگار ئـەم کابرایـە منـی کوشـتووە بـەبێ هۆ.بـۆ سوودگەیاندن منی نەکوشتووە).

٢- عن عبدالله بن عمر أن رسـول الله **(ص) قال** ، (عـذبت امـرأة في هرة سجنتها حتى ماتت فدخلت فيها النـار. فـلا هـي أطعمتها ولا سقتها إذ حبستها، ولا هي تركتها تأكل من خشاش الأرض).

واتا : ( ئافرەتێك چووە ناو ئاگری دۆزەخ.لەسەر گرتن و ئازاردانی بێچووە پشیلەیەك کە خواردن و خواردنەوەی لێ قەدەغەکردبوو.خۆڵ و خاشاکی دەخوارد تاوەکو ئەم پشیلەیە مرد).

٣- عَنْ أبي هُرَيرَة ، قَالَ : سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صلى اللهُ عليه وَسلَّمَ يقُولُ ( لا يُورِدَنَّ مُمْرِضٌ علَى مُصِحٍ).

واتا : (ئاژەڵی ساخ و تەندروست تێکەڵ بەئاژەڵی نەخۆش مەکەن).

٤- قال رسول (ص) ( اتقوا الذر (هو الغبار) فإن فيه النسمة (أي الميكروبات)

واتا : (خۆتان لەتەپ و تۆز بپارێزن لەبەر ئەوەی (نسیمەی تێدایە).

لە قامووس (القاموس المحيط) هاتووە لەزانای ( الفيروزأبادي). کە (النسمیه) بەبچووکترین ئاژەڵ دائەندرێت.

٥- لەسەردەمی خەلیفە (عمری کوری خەتاب)دا (لەکاتی بەفربارینددا گەنم لەسەر لووتکە چیاکاندا بڵاو ئەکرایەوە بۆ ئەوەی نەڵێن باڵندەیەك لەووڵاتی مسوڵمانانددا برسیبوو) ئەمەش پاراستنی باڵندەیە لە لەناوچوون.

٦- عن ابن عباس، قال - قال رسول (ص) : ( عن التحريش بين البهائم ) .

واتا: ( پێغەمبەر (د.خ) نەهی کردووە لەهاندانی ئاژەڵ دژی یەکتر).

٧- عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أنَ رَسُولَ اللهِ صَلَى اللـهُ عَلَيْـهِ وسلم قال ( بَيْنَا رجَـلٌ يمشي فَاشْتَدَّ عَلَيْهِ العَطَشُ فَنَـزَلَ بِئْـرًا فشرب منها ثمَّ خرج فإذا هو بكلب يلهث يأكلُ الثرى مِنَ العَطَشِ فقال لقدْ بلغ هذا مثلَ الذي بلغ بي فملأ خُفَّهُ ثـمَّ أمسَكَهُ بِفِيهِ ثمَ رقي فسقى الكلبَ فشكَر اللهُ لَهُ فغفرَ لهُ قالوا يا رَسُولَ اللـهِ وإنَ لنا في البهائم أجرًا قال في كُلِّ كَبِدٍ رَطبَةٍ أجرٌ).

واتا: ( پێغەمبەری خوا فەرموویەتی لەکاتێکدا پیاوێک بەرێگەیەکدا دەڕۆیشت.تینویەتی زۆری بۆهێنا دابەزی ناو بیرێکەوە لێی خواردەوە، پاشان هاتەدەرەوە بینی سەگێك هەر هەنسکە هەنسك دەکات، (زمانی دەرکێشاوە و هەناسە بڕکەیەتی) لەتینویەتیدا خۆڵ دەخوات، (لەدڵی خۆیدا) وتی: بەخوا من چۆن تینوویەتی زۆری بۆهێناوم ئەمیش هەروایە.ئەوسا پێڵاوەکانی پێی پرکرد لە ئاو و بەدەمی

دەیگرت پاشان لەبیرەکە سەرکەوتە سەرەوە و سەگەکەی ئاودا و خواش بەوهۆیەوە سوپاسی کرد و لێی خۆش بوو) هاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە لەبارەی مەڕوماڵات و بێ زمانیشەوە هەر خێرمان دەست دەکەوێت (پاداشتمان بۆی هەیە)؟ فەرمووی: لەهەموو خاوەن جگەرێکی تەڕدا (مەبەستی هەموو گیانلەبەرێکە) خێر و پاداشت هەیە.

**هاندان بۆ پاراستنی پاك و خاوێنی مرۆڤ لەفەرموودەکانی پێغەمبەری نازدارمان محمد (صلى الله عليه وسلم)**

١- قال رسول (ص) : (تخللوا فإنه نظافة، والنظافة تدعو إلى الإيمان، والإيمان مع صاحبه في الجنة)
واتا: ( (لە کاتی دەستنوێژ شوشتندا پەنجە بخەنە نێوان موەکانی ڕدێن و نێوان پەنجەکانی دەست و پێیەکانتانەوە، چونکە ئەوە پاکو خاوێنییە و پاکوخاوێنیش مەردم بانگ دەکات بۆبڕواداری و بڕواداریش لەگەڵ خاوەنەکەیەتی تا دەیبات بۆبەهەشت).

٢- قال رسول اللة (صلى الله عليه وسلم): (الطهور شطر الإيمان).

واته: (بەباشی دەستنوێژ شوشتن نیوەی بڕواداریيە).

٣- قال رسول اللة (صلى الله عليه وسلم): (النظافة من الإيمان).

واته: (پاکوخاوێنی لە ئیمانەوەیە).

٣- قال رسول اللة(صلى الله عليه وسلم) : (غسل يوم الجمعة واجب على كل محتلم).

واتا: (هەرتاکێکی بڕوادار کە کەوتبێتە تەمەنی بە پێویست بوونی ئەرکە ئایینییەکان لەسەری، ئەوە پێویستە لەسەری، کە ڕۆژانی هەینی خۆی بشۆرێت).

لە جێگەیەکی دیکەدا دەفەرموێت: (حق لله على كل مسلم في كل سبعة أيام: يوم يغسل فيه رأسه وجسده).

واتا: (مافی خوایە بەسەرهەرتاکێکی بڕوادارەوە کە هەر حەوت ڕۆژەی جارێك سەر و لاشەی خۆی بشۆرێت).

٤- قال رسول (ص):(لولا ان اشق على أمتي لأمرتهم بالسواك عند كل صلاة).

واتـــــا : (گەربوايـــــە و لەبەرئـــــەوە نەبوايـــــە كـــــە لەسەرشوێنكەوتووەكانمی گران نەكەم، فەرمانم پێدەدان كە بۆهەر دەستنوێژ و نوێژێك، سیواك بكەن).

لە شوێنێكی نردا پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وعلى اله وسلم) دەفەرمووێت : (السواك مطهرة للفم مرضاة للرب).

واتا: (سیواككردن پاكژی و خاوێنییە بۆ نێو دەم و دان و ڕازی كردنی پەروەردگارە).

٥- عـن جـابر ابـن عبـدالله انصـاری (ر.ض) قـال: (أتانـا رسـول الله(ص) زائرا في منزلنا فرأي رجلا شعثا قد تفرق شعره، فقال: أما كان يجد هذا ما يسكن به شعره؟).

واتا: پێغەمبەر(صلى الله علیه وسلم) بـە سەردان هـات بۆ ماڵمـان و پیـاوێكی بـینی، كـە سـەری بـژ بـوو و شـانەی نـەكردبوو ودای نـەهێنابوو، بـەدیتنی دیمەنەكـەی كـابرا، پێغەمبـەر (د.خ) نیگـەران بـوو و فـەرمووی: باشـە ئەمـە شـتێكی بەرچـنگ نەكـەوت كـە سـەری پـیّ جـوان بكـات و بەوشێوەیەنەبێت؟!).

٦- قال رسول (صلى اللة علية وسلم): (إن الله طيب يحب الطيب، نظيف يحب النظافة، فنظفوا أفنيتكم ولا تشبهوا باليهود).

واتا: (خواى گەورە خاوێن و پاك و بۆن خۆشە و پاكوخاوێنیشی پێ خۆشە، دەئێوەیش ماڵەكانتان پاكوخاوێن ڕابكرن، نەكەن وسایی جووەكان بكەنەوە).

٧- قال رسول (ص) : (كانَ إذا عَطس غطى وجههُ بيدهِ أو بثوبهِ) رواه الترمذی.

واتا : ( كاتێك پێغەمبەر (د.خ) دەپژمی دەموچاوی بەدەستی یان بەجل و بەرگەكانی دادەپۆشی.

٨- قال رسول اللة (صلى الله عليه وسلم) : (الله جميل يحب الجمال).

واتا : (خوا جوانە و جوانی خۆش ئەوێت).

لە كۆتاییدا ئەوەندە دەڵێم: هیوادارم ئەم دەقە پڕ لە بەخششانە، بۆمان ببنە مامۆستا و پێشەنگ، كە بتوانین لێیانەوە دەربچین بۆژیانێكی پڕلە پاكوخاوێنی و ژینگەیەكی پارێزراو و بە هەستی پیرۆزی بەرپرسیارێتییەوە ڕەفتاربكەین.

**تێڕوانینی ئیسلام بۆ ژینگە و نموونەی هەندێك ڕاستی گرنگ لەو بارەیەوە:-**

١- لەشەریعەتی ئیسلامیدا بۆچوونێکی گشتگیرانەی هەیە سەبارەت بەچەمکی ژینگە. کەخۆی دەبینیتەوە لە (مرۆڤ و ئاژەڵ و ڕووەك و بێ گیان و ئاووهەوا)، مرۆڤیش لەم نێوەندەدا بەڕێزترین دروستکراوەکانی خوای گەورەیە (ولقد کرمنا بنی ادم) وە گشت دروستکراوەکانی تری بۆ مرۆڤ لەسەر ڕووی زەوی ژێربار و فەراهام کردووە بۆ سوودوەرگرتن و ئاوەدانکردنەوەی ئەو زەوییەی کەخۆی تێدا جێنشینە.

٢- ئایینی پیرۆزی ئیسلام سەیری ژینگە دەکات لەچوارچێوەی (جێنشینی مرۆڤ). واتا هانی مرۆڤەکانی داوە لەچوارچێوەی هەڵسوکەوتەکانیدا هەوڵی ئاوەدانکردنەوەی زەوی بدات و بوونەوەرەکانی ناوی بپارێزێت و زیادەڕەوی نەکات لەبەکارهێنانی بەخششەکانی خودای گەورە.

٣- شەریعەتی ئیسلام بنەمای (ڕێگرتن لەهۆکارەکان و خراپەکاری) داناوە، وەك کۆت و بەندێك بۆ هەڵسوکەوتە

زیادەڕەوییەکانی مرۆڤ لەبواری ژینگەدا، بۆئەوەی چوارچێوەیەك دابنێت بۆ ئارەزووە بێ سنوورەکانی مرۆڤایەتی، ئەمەش بنەمایەکی گرنگی ئیسلامە، بۆ بەرژەوەندی بەندەکانی لەڕوانگەی ماددی و مەعنەوییەوە، کەبتوانێت مرۆڤ لەچوارچێوەی سنورێکی دیاریکراو ڕێگەپێدراودا بتوانێت مامەڵە لەگەڵ ژینگەی سروشتی دەووروبەر بکات.

٤- شەریعەتی فیقهی ئیسلامی بناغەیەکی ڕێکخستنی وەرگرت کە باسی گرێبەستە گرنگەکان دەکات کەپەیوەندی هەیە بە وەبەرهێنانی زەوی وەکو گرێبەستەکانی (ئاشتی و کشتوکاڵ و ئاودێری) زیندووکردنەوەی زەوی وشکبوو، بوونی ئەمانە گرنگی ئەوە دەردەخەن کەئیسلام گرنگی داوە بەسەرچاوەکان و دەرامەتە سروشتییەکان. بۆ ئەوەی زەوی بکات بە بەهەشتی دنیا بۆ مرۆڤەکان لەڕووی کشتوکاڵ و چاندن و ئاوەدانییەوە.

٥- ناوەڕۆکی پاراستنی ژینگە لەچوارچێوەی شەریعەتی ئیسلامدا زۆر ڕوون و ئاشکراو فراوانە، کەمانەوە و پاراستنی بوونی سەرچاوەکان دەگرێتەوە، بەگوێرەی

چەسپاندنی یاسا و لەچوارچێوەی سنوورێکی ڕێگەپێدراودا، هەمیشە ئیسلام هەوڵی پەرەپێدانی سەرچاوە و داهاتەکانی بۆ گرۆی ئادەمیزاد داوە کەبریتییە لە گەشەسەندنێکی باشتر و گشتگیر بۆ سەرچاوەکان، ڕێگرتن لە کەمبوونەوەی بەرهەم و داهاتەکان لەڕێگەی خراپ بەکارهێنانیان.

٦- پابەندبوون بەپاراستنی پاك و خاوێنی ژینگە لەکارە سەرەکیەکانی پێغەمبەری خوا (د.خ) بێت. بووە، وەهەمیشە سوور بووە لەسەر ئەم تەوەرەو هەمیشە ئامۆژگاری کردووین.ئەویش لەڕێگەی چەندین دەق و فەرموودەوە، کەدەفەرمووێت (النظافة من الايمان) واتا : پاکوخاوێنی لەباوەڕەوەیە. کەئەمە بناغەی پاراستنی ژینگەیە لە ئیسلامدا.

٧- هەمیشە شەریعەتی ئایینی ئیسلام دڵنیامان دەکاتەوە کە پەیوەندییەکی بەهێز و ڕاست لەنێوان پێکهێنەرەکانی ژینگە (ئاو و هەوا و خاك ) هەیە، هەروەك چۆن هەوا ئاو هەڵدەگرێت و بۆ بەرزاییەکان و پاشان لەشێوەی باران دەبارێتە سەر زەوی و پاشان بەو هۆیەوە گژوگیا و

دارودرەخت گەشــەدەکات و پاشــان مــرۆڤ و ئاژەڵــەکان خۆراکی خۆیان لێ دەستدەکەوێت و لەسەری دەژین.

٨- پاراســتنی ژینگــە لەشــەریعەتی ئیســلامدا سپاردە و بەرپرســیاریەتیە، کــە ئیمــان و بــاوەڕ داوای دەکــات، وە پێویستە مرۆڤ ملکەچی بەخششەکانی خوای گەورە بێت چونکە خوای گەورە وەك تاکە بوونەوەرێك ڕێزی گرتووە و کردوویەتیــە جێنشــینی زەوی، بۆیــە لەســەر مســوڵمانان پێویستە داخوازییە شەرعیەکان جێبەجێ بکەن و پەیڕە و بکــەن، ژینگــەپارێز و چــاودێریکردنی سەرچــاوەکانیش دەکەونـە چوارچێوەی ئادابە شــەرعییەکان، چونکە خـوای گـــەورە فەراهــــەمی کــــردووین و سۆزیشـــــی بـــۆ دروستکراوەکانیشی هەیە .

## سەرچاوەکان :-

١- بورهــان محمــدامین، تەفســیری ئاســان. بــۆ تێگەیشــتنی قورئــان، لەبلاوکراوەکانی کتێبخانەی رۆشنبیر، سلێمانی- هەولێر ،٢٠٠٤.

٢- نەشری ئیحســان،(پوختەی ســەحیحی بوخــاری) وەرگێرانــی (لیژنەیــەك) ،چاپی یەکەم، چاپی مەهارەت، تاران، ٢٠١١،لا٤٥٧.٤٦٥.

٣- د.علــی أوزاك، البیئــة فــی القــرآن الكــریم والحــدیث النبــوی الشــریف، موسسه الالبیت الملكیه للفكر الاسلامی ، عمان، ٢٠١٠، ص١٠.

٤- نەرمین عومەر، گۆڤاری هەیف، ژماره (٢٦) ، سلێمانی ، ٢٠١٢، لا١٣.

٥- ڕاوێــژ محمــد، گۆڤــاری هۆشــیاری ژینگــەیی ، ژمــاره (١) ،ڕێکخــراوی ژینگەپارێزی قەڵادزێ دەری ئەکات، ئەیلوولی ٢٠١٣،لا٢٦-٢٧ .

٦- مەلا عبدوڵلا شیرکاوەیی ، ژینگەپارێزی لەڕوانگەی ئیسلامەوە ، چــاپخانەی (لەسەر ئەرکی دەستەی پاراستن و چاککردنی ژینگە) ، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠١٣،لا١١٥-١٩.

٧- مەلا عمر چنگیانی ، ڕۆژنامەی خەبات، ژمــاره (٣١٣٠) ، بــەرواری ٢٧-٣-٢٠٠٩،لا١١ .

٨- لەئەنتەرنێتەوە :-

www.ansarsunna.com
www.saaid.net
www.almoslim.net
www.mercyprophet.org

www.fiqh.islammessage.com
www.irbidworld.com
www.library.islamweb.net
www.ejabat.google.com
www.byotna.kenanaonline.com
www.irbidworld.com
www.kaheelv.com
www.quran-m.com
www.haiv.org
www.taddart.org